شیعر بۆ منداڵان



# خەرمانلۆغە




ابراهیم احمد شوان

١٩٨٥

# پێشکەش :-

- بەو باوك و دایکانە بێت کە ئەرکی خۆیان لە
پەروەردەکردنی جگەر گۆشەکانیان دەبینن .

- بەو مامۆستایانە بێت ، کە رەنجە بای ناوەخت
بەرکیان ناخوات لە فێرکردنی زارۆکەکانمان .

- بەو میشك بیرانە بێت ، کە شەونخونی دەکێشن
لە پێناوی ڕەخساندنی چاکترین پەیڕەوی
پەروەردەیی .

# پێشەکی

ماوەیەکە شاعیرەکانمان ئاوڕێکی دڵسۆزانەیان لە منداڵانی کورد داوەتەوە و بە هۆنراوەی نایابیان مێشکیان ئاو دەدەن پەروەردەیان دەکەن . جا لەبەر ئەوەی کە خۆم ماوەیەکی چاک لەنێو منداڵانی فێرگەدا بەسەر دەبەرم ، بۆیە خۆم بەکەمتەرخەم زانی ئەگەر سوارەیەک لە شیعر نەخەمە سەر ئەو خەرمانەی کە کۆکراوەتەوە و بە هیوای ئەوەی بزەیەک بخەمە سەر لێوی جگەرگۆشەکان بەرەو رەوەی شیعرەکانیان ببەم بۆ ئەوەی ( خەرمانلۆغە)ی خۆیان وەربگرن .

ابراهیم احمد شوان

١

# هەرمەزنە

منداڵەکان هەموو شتێ — بە بچووکی لە دایک دەبێ

سەرەتای هەموو ڕووداوێ — دەستپێ دەکا لە هەنگاوێ

خۆشەویستی ئێوەش وایە — لە خەندەیەکێ ساوایە

مەزن دەبێ و چڕۆ دەکا — هەڵدەچێ و بەر و بۆ دەکا

تەنیا تاکە شتێ لای من — لە سەرەتا هەتا مردن

هەر مەزنە و جێگری لە دڵ — گەردوونە دەڵێی نابم هێڵ

ئەویش گیانە نیشتمانە — کە ئینیاس دنا و نیشانە

دەشت و دەر و شاخ و چیای — دار و بەرد و گوڵ و گیای

شنگی چاو و بیر و تینێ — تیماری زام و برینێ

# زستان

قوتابیەکان ئەوا زستان — هاتە لاتان بەفر دەهێنان

بە دوباران و بەفر و شەختە — بوو زریانی بە ناوەختە

هەموو لەشمان رەق دەکاتن — بەرەو خۆرهەتاومان دەباتن

بەرگم لێرە هەموو کەسێ — لە سەرمای زستان نا ترسێ

تەنیا یەکێ کە هەژاربێ — باری هەردەم نالەباربێ

تەنیا یەکێ کە داڕوتبێ — لەگەڵ ئەو دنیا جووت بێ

گەرمانی خۆشی نەدیبێ — گەدەوی هیچی پێ نەکەنیبێ

کەرچی پیاوی خاوەن پارە — هەموو شتێکی لەبارە

ئەودوری گەرم جێگەی نەرمە — بەفر و سەرمای لای ئەو نەرمە

بۆیە دەبێ هەموو چاوێ — ژێر رەنگا رکەرێ لە بەر دناوێ

گشت پێکەوە دەستمان گرت — هاوبەشین لە خەندە و گرین

با یارمەتی هەژار بدەین — لەم بارەوە هیچ کۆڵ نەدەین

چونکە هەموو وەکو یەکین — پەروەردەی یەک دڵیک و براوکین

هەرکەسێکی خودان جیاکە — خۆشەویستی خودای تاکە

# گزنگی بەیان

قوتابییەکی چاپووکەم ئازا و چوست و زیرەک و سوورکەم

بەیانیان کە هەڵدەستم ڕووگەش و بەهەوەسم

دەست و چاوم دەشۆرم بەرگوپۆشم(1) دەگۆڕم

ئەوسا کە بە هێمنی دەخۆم نانی بەیانی

دەست دەدەمە جانتاکەم لەڕێ بە هەر کەس بگەم

بە وردیلەوەچ هەراش پێی دەڵێم بەیانیت باش

لەفێرگە شاد هەمیشە بزێوی ناکەمە پیشە

کە هاتە گوێم دەنگی زەنگ ڕیز دەبم و بەبێ دەنگ

دەڵێم بژی نیشتمان لانری و ردوو ڕشتمان

بژی مامۆستای مەزن لە تێکۆشان نابەزن

بژی تۆ تا بخانەکەم        خۆمی بە قوربانەکەم

(1) بزگور : جل و برگ

# سالی نوێ

واسەر لە نوێ سالی خوێندن — گەڕایەوە دەست لە گەردن

کڕاوەی پێنووس و پەڕتووک — پڕازانەوە بەرچەشنی بووک

قوتابگەکان ژیانەوە — پاشی پشوو حەسانەوە

ئەندامەکانی وەکو هەنگ — کەوتنە جووڵە چوستاوی لەنگ

شایەڕی زانین پەخشەکەن — تا بڵێی ژینی پێ نەخشەکەن

تیشکی ئەچاوگی نەرم و نووترک — دەداتە بەرزەبڕی کوترک

منداڵان بۆ دوا ڕۆژی ژین — دەکرێنە بنچینەی بەرزترین

تا ببنە نیشتمان پەروەر — بەپێی ڕاستی دادوەر

خوێن دیست و بەنمەک بن — بۆ وڵاتیان بەشەرمەک بن

بۆ بەشەری تاریک چرا بن — لەگەڵ یەکدیدا برا بن

# تەندروستی تاجە(١)

من تۆتا بیرکی پاکم
زۆر لەخۆشەویستە و جیا ناکەم

لەشی دیارگم خاوێنە
مێشک گەردە وەک ئاوێنە

هەموو حەفتە خۆم دەشۆم
بۆ جێی پیس هەرگیز ناچم

گەر نینۆک سەر دەربێنێ
نینۆکگر دەیقرتێنێ

دوژمن گەورەی مێشم
گەر جارێ بێتە پێشم

بە دەرمان دەیپرشێنم
بە چەپلەکێ دەردێنم

شتی سەروانەپۆشراو
نابێ بچێتە ئەم ناو

چونکە پیس و پڕ تۆزن
بۆ گەدەم زۆر ئالۆزن

تف لە زەوی ڕوو ناکەم
بۆ نەخۆشی بەرپا کەم؟

تۆتابخانم لاخۆشە
سەرچاوەی بیرو هۆشە

خاوێنی لە ئۆباڵمە — چونکە دووەمین ماڵە

هەوشەو ژووری بە پاکی — ڕادەگرم تا زۆر بە چاکی

جا قوتابیانی بەڕێز — لەگەڵ پاساوەرنە ڕێز

خۆ بە پاکی ڕابگرن — تەندروست بن تا مردنێ

خاوێنی دڵ پڕ باوەڕە — پیسیش بێ هام وگەڕە

(1) لە هەمان کاتی بڵاوکراوەتەوە .

# سروودی مندالێکی کوردی ئێرانی

ئێمە کوردین نەوەی مادین     تامەزرۆی سەروەکەی دادین

لە جیاتی کوتەکی ناحەزان     بێ ئاشیان و بەربادین

چەند لە مێژە تاکو ئێستا     خوێنی لاوانمان نەوێستا

لە پێناوی بوون و مانمان     سواری بیری ئازادەهستا

بانە یاران بە چرنووکی     گوشت دار نخێ دەمووتووکی

سەرمان ئابێتە دامی زین     دانە بەزین بەرەهەتووکی

میللەتانی جیهان هەموو     سەربەستن و بە ئارەزوو

ئەلقەی کەلەپچەیان پچراند     هێزی دوژمن بووە کادوو

ئێستا کەوا لە ناو نازوو     نیعمەت دە ژین بە ئارازوو

پێداویستی ژین بەشەرەکەن     هەڵیان کردووە قۆڵ و بازوو

بەڵێنێکە و مۆرکراوە      بە خوێنی ئاڵمانە نووسراوە

خەبات هەتا تۆڵە سەندن      تا ماڤمان دێتە ئاراوە

# پیاوی سبەی

قوتابیی زیرەك ڕۆڵەی هوشیارم — چاوتیژ و نەبەرد ئازا و بەرکارم

شاگوڵی باخی ژیانی میللەتم — تیماری زامی نەبوونی داومەرینەت

ئاڵای شەکاوەی بانی زانستم — پەڕیکی تیژڕەوی دەریاو پڕ هەستم

ئازیزم تۆ خوا دیدەت هەڵینە — شاڕێگەی ڕاستی خەباتت ببینە

نەکەی بەبێ ڕێك چاو بۆ یار و نەیار — بڕوانی نەخۆت دەتخاتە ئازار

وشەی مامۆستات لەلا بەرز بێ — هەمیشە ڕێزیت لەسەر فەرز بێ

ئەو مامۆستایەی وەك مۆم گڕ دەگرێ — ڕێی ڕوونی دەکاو پەیڕەوی دەکرێ

نەك ئەوەی تۆوی پیسی دەچێنێ — پەرەی بێ گەردی بیر دەگەڕێنێ

هەتا دەتوانی برای قوتابی — لەگەڵ خوێندنت گەڵێ تەبا بێ

چرکەیێ کاتت نەدەی بە فیڕۆ — لەکیست دەچێ و بێ سوودە بڕۆ

هەر كەسێ نزمی تەمەن نەزانی      بێ گومان گێلە وەسوو کە بەزانی

بەزیو بێش چەلە و داری بخا بەرە      مرد و خەو و نا نخۆرێکی جێنگرە

# کۆتایی ساڵ

وائەم ساڵی خوێندنمانە — ساڵی کۆشش کردنمانە

ماڵ ئاوایی لێمان کرد — تەمەنمانی بۆ خۆی برد

جائەو کەسەی دەرچوو بێ — بەکەیف و ئارەزوو بێ

بەرووێکی گەلێ خۆش — بادەی ئومێد دەکا نۆش

لە بۆ ساڵی داهاتوو — هەڵ دەکا قۆڵ و بازوو

هەرزەکا هەموو کاتێ — بە خوێندنی بگاتێ

بەڵام ئەوەی تەمبەڵ بێ — لە ژینا لەهەڵ هەنبێ

هەر خەریکی یاری بێ — لە قرە و لاساری بێ

ئەرکی دوێنێی بۆ ئەمڕۆ — هەڵبگرێ و بکا درۆ

دزی تەمەنی خۆ بێ — شەرپ لە تۆنەک لەشۆبێ

هەمیشە کاری ساڵی    وەردەگرتین بەکاڵی

گوناهی خۆی لەسەر ستۆی    با دەست بگرێتر لەسەر سەرنۆی

پێشینەکان دەفەرموون    چیتان چاند ئەوە دەدروون

# خوێندنی تەوزیمی

منداڵەکان وەرن وەرن　　لەسەر ڕێنچکان گوێم لێ گرن

ئەمڕۆ قسەی خۆشم پێ یە　　ژیرو بیرو هۆشم پێ یە

قشتیلەکان[1] دەبێ هەموو　　لیێ هەڵبکەن قۆڵ و بازوو

ڕوو لە قوتابخانە بکەن　　تا فێ بگەن، تا پێ بگەن

هەموو کەسێ لە فێرگە دا　　یەکسانە پاشا یان گەدا

کتێب و پێنووس و دەفتەر　　لاستیک، بۆیە، قەڵەم دادەر

ئامێری ئەندازە ئەتڵەس　　بە خۆڕایە بۆ هەموو کەس

تەنیا ئەوەم لێتان دەوێ　　چاوتان لە کۆششتن نەخەوێ

---

(1) قشتیلە : جوانکیلە

ئێوە زادەی ئەم نەتەوەن          پیادی دوارۆژن و بۆی نەوەن

سروودن بۆ مانی خوراد          زەمینن بۆ تیشکی هەتاو

رەوێنری تەم و مژن          خوێنی خوێنمژانمان دەمژن

# پێنووسەکەم

پێنووس چەرکی دەستمە      زاری بیروهەستمە

سەرنگەری دەروونمە      پاوێژکەری بوونمە

هەورە بۆ خوێندەواری      زانیاری لێی دەباری

لێی بۆ نۆش دەکەم ئەشکرادی      زانستی، تالەداوی

نەزانین پزگار دەبم      هۆشمەند و هۆشیار دەبم

مرۆڤ لە سایەی پیاوە      ناوی ئەوە لەو ناوە

جێگەی لە مێشك و دڵە      لە گاسەی مێشکا گوڵە

گوڵە و هەرگیز ناوەرێ      هەرچرکە پێی بەبەرێ

خۆ دەنوێنێ و پێ دەگات      تا شاگەشکەمان دەکات

لەگەڵمان گەورە دەبێت      دەمرێ وئەو نامرێت

# هیوا و هۆگر

## هۆگر

هیوا بۆ وا تەنگاوی — وادە ڕۆی بە لەمە شتاوی

خوانە خواستە چی بووە — بەم جۆرە بە شۆ گاوی

## هیوا

بۆچی هۆگر نازانی؟ — ئەزموونمانە بەیانی

بخوێنە لەمە زووە — نە خۆ بلێی نەم زانی

## هۆگر

هیوا تۆ هەر بخوێنە — خەو لە چاوت بستێنە

منیش قوتابیەم لاخووە — مەردی لەمەندی سۆبێنە

## هەوا

نۆگر قوتابییەکی ڕێکە          جالی بەرچەقی ڕێیە

زۆری تەمبێ کردووە          بە ڕێنیەی لەبەر دووبێتیە

## هۆگر

باشە لەیوا چی بکەم          لە وانەکانم ناگەم

واقوڕیەم تۆراندووە          چۆن بچمە ئەزموونەکەم

# هیوا

وەرە ئەی ڕدوو وەکو شێر          دە خوێنێنی وزگی تێر

بەڕی دەستی ماندووە          تەمبەڵ بێ خێرە و بێ بێر

# هۆگر

هیوا ئەی تاکو ما بم          دە بێ لە تەلاش دابم

یا لە نەم دوڕاندوە          لەگەڵ خوێنێری تە با بم

# تۆبەی گورگی مەرگە

زگیزبنەوە گورگێلی بۆر — لە ناو ڕانە مەڕێکی زۆر
زڕندانەوە بە جلێسی — بە کەیف و هەوەسی پیسی
هەر ڕۆژێ ئەوەندێکی دەفڕاند — زگی لەوەندێکیشی دەدڕاند
لە ناکاو دا شێرێکی پیر — لێی پەیدا بوو کەوتە تەگبیر
جێی پێ لەوە بوو گورگی بەدناو — چوە لای شوانی زگ هەو تاو
پێی گوت ئێمە ئاشنای یەکین — دەبێ لە بیر کەین ڕک و کین
هەر دوو بەرەو ڕەدەی یەک خاکین — لە تەنگانە بۆ یەک کاکین
بائە و شێرە بە دەرەو وشتە — لە دوژمنی وردو درشتە
لە ناو بەرێ ئەمە تا گۆشت — دەڕژێ بێ بۆ لەوەسەر زەنشت
مەرجە منیش برای مەڕ بم — نەی خۆم موفتێری لەوەڕ بم

بڕۆم شوانی دونیا دیتە نەفرێوا بەرم کەلک قیتە

هەرچەند مەڕەوالەم بەرگە زانی تۆبەری گورگ مەرگە

سا پیرە شێری لێ هەاندا خۆشی تەنگەی بەرگۆمانیدا

تا تۆزەی هات تە پاندیان جا بە تەرمەوە بردیان

خستیانە بەر سەگ و تورگە لاشەی پیسی مامە گورگ

---

تەیا نەیان ٤ زەریان لێدا

# شەووڕۆژێکی قوتابی

"١"

بەیانی زوو پێش خۆرهەڵات
کە چۆلەکە جریوەی هات
خەوسووکم وەک خەوی کەرویشک
بێ خۆگنخاندن و باوێشک ...

ڕاست دەبمەوە و جێم ڕێک دەخەم
نەخۆ دایکم بگرییە خەم

ئەوسا دەست و چاوم دەشۆم
خۆ دەگۆڕم و نانم دەخۆم

خشتەی وانەکان دادەنێم
لە ڕێگادا کێ هانە ڕێم

بیانـــــبوو یاخۆ وڵاش

دەڵێم گیانە بەیانیت باش

بەسەر شەقام گوزەر ناکەم

گیانم تووشی زەرەر ناکەم

لەسەر شۆستە هۆشمەندانە

دەڕۆم هەتا قوتابخانە ...

قوتابیەکی هۆشمەندم "٢"

چاو تیژ و سەربڵندم

کە مامۆستا هاتە ژوور

دادەنیشم بێ قسوور

کتێبەکەم دەر دێنم
خۆ لە کەس ناگرێنم
گوێ لە مامۆستا دەگرم
بە خەیاڵدا هەڵنافڕم
قسە و نوقرچ و کرنیت
منگە و پرتە و لەرلێوریو
مامۆستا زویر دەکەن
وانە کە بێ خێر دەکەن
کە پرسیارم لێ کرا
بێ خۆبادان و دەرا

پەنجەرەی خۆم بڵند دەکەم
ئەوسا دەڵامی دەدەم
گەر داوای ئەرکیشی کرد
بەچرکەیێ دەستوبرد
لەپێشە خۆم دادەنێم
تا زۆر باشە ئەدا پێم
کە لێدرا زەنگی پشوو
دەچمە دەر بە ئارەزوو
بێ پاڵدان و پاڵەسوو
نە خۆیێم بڵێن بەدخوو

"٣"

کە لێدرا زەنگی ماڵێ

لەگەڵ هەموو منداڵێ

کتێب دەگرمە ئامێز

بۆ ماڵێ دەڕۆم بە ڕێز

لەسەر جادە و لە کۆڵان

بێ شەڕە شەقەو باڵدان

تا ماڵێ هەنگاو دەنێم

کتێبەکان دادەنێم

دوور لە منداڵی ساوا

نەک بدڕێن لە ناکاوا

نیورانی هەموو ماندین

لەگەڵیان دەچمە ناندینێ

خواردن دەخۆم بەکەوچک

چێشت نارێژم بە پشک

جا تۆزێ پشوو دەدەم

دەچم سەرە خەوێ دەکەم

پاش خەو نۆبەی یاری یە

کە بۆلەش دیاری یە

لەشێ وەرزشی نەبینێ　　دەپەزێ و شەنگی نامێنێ
ئەوها بەرپەڕینێکی گەش　　کتێب دەگرمە باوەش
دەیخوێنم تاقێ دەگرم　　تا لە دوا ڕۆژیێ دەگرم
کاری ئەمڕۆم بۆ سبەی　　هەڵناگرم تابێ وەی
دەبم لەشا نوێ ژیان　　بێ هوودە خۆزگە و گریان

(٤)

گەر خۆر بەرەو ئاوابووە چوو　　شەو داهات دونیا تاریک بوو
بەرەو ماڵێ هەنگاو دەنێم　　چاو لە دەرزێم و ناگرێم
لە ناو شەقام و کۆڵانە　　نا هەوێم چەرشی جۆلانە
هانا دێ ئێوارەم دەخۆم　　دەست و دەم و دانم دەشۆم
ئەوجا لەبەر تەلەفزیۆنە　　دەبم بۆ فلیمی کارتۆنە

ئەگەر وا ئەزانی قوتابخانەش      بەرجێ دێنم بۆ خەتەر و بێ خەمێش

زوو دە خەوم تا بەیانی      زوو وشیار دەبم بۆ دونیای جوانی

# کاریلەکەم

کاریلەکەم سپی و قەشەنگە — لە هات و چۆیە کجار گەشتە
هۆگرمە و بێ من بەرنا کا — هەرگیز خۆشی منی بەرناکا
هەرکە دەڵێم گەدی گەدی — وێتە باوەشم هێدی هێدی
دەستی بە سەرو گوێی دادێنم — جار بەجارێش مۆری دادێنم
بۆ هەرچی بچم بێ بەرتیل — لە دووم دێ بۆ دەشت و قەرسیل
لەپێشم بەرهەم بازانێ — دەڕوا مانەوە و بووە نازانێ
پێکەوە دەیبەم لە دەرمانێ — چاوی پیماوە پێ نەکانێ
مەڕ چەرچەر قۆی لە سەرزنێ — تا دڵم پڕ بکە سەرزنێ

---

قشتی : خنجیلانە

# سالی منداڵ

بچکۆلەکانم جگەرگۆشەکان      کانگای ئارام و بۆنە خۆشەکان

جیهانی جوانی لەژێر پێتانە      کانی سەربەرزی لە نێوچاوتانە

خێزان بێ ئێوە وەک دەشتی چۆڵە      هەردەم باران و زریان و هۆڵە

دەک پیرۆزتان بێ ساڵی هەزار و نۆ      یا خوا هەرگیزتان بێتە بەر قاشۆ

بە تکۆلە ساڵی ئێوەی بێ تاوانە      ساڵێ بۆ باباتان بێتە وەناوانە

بێ شەرمە دایکیشتان چاوپاو لێتانە      ژیانیان خاکی سەرڕێی پێتانە

# وەرزش بکەن

وەرزش بکەن، وەرزش بکەن
تا دەتوانن، کۆشش بکەن
وەرزش تین و هێزی گیانە
وەرزش ڕێبەری ژیانە
وەرزش لەشتان بەتین دەکا
وەرزش پیاوتان لێ شین دەکا
وەرزشەوان خۆشەویستە
بە ئارام و خۆشەویستە
لەش و بیر و باوەڕ ساغە
تێیدا هەیە قیوە بۆ دەماغە

# هاوینی دێیەکەم

دێم دەشتێکی فراوانە — لەناو دەشتی دزەییانە
ئاقاری(1) گشت دەغڵ و دانە — ناعورو شینایی جوانە
بۆ گوندیش خەلە و خەرمانە — چەنجەڕۆ شەعزە کێشانە(2)
شەنەو گێرەدابەستانە — ڕەوەسە بڕکردنی سەپانە
یا خود تۆزی دابەستانە — فیتەفیتی کاکەی شوانە
دەمەهەرەی مام گاوانە — چەقەقەی لولەی ناوسەگانە
گردبوونەوەی دیوەخانە — دامەکردن و نۆڕ ههسکانە(3)
لەچەرگەی ئەم دیمەنانە — فاڵ بووم و بۆم مایەی ژیانە

---

(1) ئاقار: دەشت و دەر
(2) شەعزە کێشان: کێشانەوەی لاسکی دانەوێلە بەهۆی ئامرازێکەوە کە پێی دەڵێن (شەعزە) و لە دار دروست کراوە.
(3) نۆڕ هەسکان: جۆرە یارییەکی پیاوانەیە کە هەر پیاوێ (9) بەردی لەناو خانەکان دادەنێ بە هەردووکیان دەکا (18) بەرد

# دراوسێکەم

دراوسێکەم زۆر خۆش دەوێ — لەکنیانم(١) هەموو شەوێ .

یەک ماڵین لە گەڵ یەکتردا — هاوبەشین لەخۆشی و شەڕدا .

هاتوو چۆمان یەکجار گەرمە — ڕێزی هەموویان لەسەرمە

بە چاوی پیس سەیری ماڵیان — تەماشای ماڵ و منداڵیان

ناکەم ، هەمیشە تا هەمە — چونکە کارێکی زۆر کەمە

بەرد ناوێژمە حەوشەکەیان — سەگ و مەڕ و مریشکەکەیان

---

١- لەکنیانم : لەلایانم

لەگەڵ منداڵیان شەڕ ناکەم      کاری بەد و بێ فەڕ ناکەم

چونکە خوداو پێغەمبەرمانی      بە توندی داویانە فەرمانی

لەگەڵ دراوسێیان چاک بین      بە وەفاو پاک و بێ ماک بین

# دەبێ کێ بێت

مرۆڤێکی بە ئارامە
بەڕۆژە و هەرمۆی بە پەیامە

خودان بە ئەرەیەکی بەرزە
قوتابخانەی سەرە ڕووی ئەعزەزە

ئێمە ئەمووی دەرچووی ئەوین
لێی فێر دەبین ژین و ئەوین

مافی بۆمان شانازییە
ڕازی بێ یەزدان ڕازییە

شایانی ڕێزلێگرتنە
چاکەی لەگەڵ هەر بەستنە

تا ناسەرمان دێت و دەچێ
هەرگیز نابێ لەبیرمان بچێ

گەر لەبیری کاری کرد و دەبێ
نەیار بەرخۆ دەکری خەرجێ

گەر نازانی هێشتا کێیە
(دایک)ە وە هەردەم خێری پێیە

# دێ قوربان

منالێکم بە چکەی گوند — بەرچاو تیژو سەربلند

برای دانیشتوی شارم — بێ سەروتن لە کارم

دنیە کەرمان نوێشی یە — گشت بێ داویستی لێخایە

قوتابخانە بە دیاری — بۆی هێناین خوێندەواری

هەردوو بەجووتێکی وکوڕ — دەچینە فێرگە بەرگوڕ

تاکو شەکرای زانین — دەنۆشین بۆداری ژین

لەولاوە زۆر خۆشمانە — بۆ خزمەتی هەموانە

خوانەکا گەرنە خۆشی — ژەهری بەبێ لێ نۆشی

دەچینە لای پزیشک — دەی هاوێتە بەرتیشک

چیی بوێ پێی دەبەخشی — دنیە دەبەپڕ و گەشی

قاناقی بیرمان گۆڕی    ئاومان بۆ دێ بە بۆڕی

کنزۆ دەوڵەت ڕژی    بە بیری ئێرتیوازی

واکارە بالە باوە    بۆ مالان ڕاکێشراوە

فانۆس و چراکزن    شەرمەزارن وەك دزن

زەوی و زاری کشت و کاڵ    دراوەتە زۆربەی ماڵ

تراکتۆر و دەرپاسە    لە جێی هەوجار و داس

دەشت و دەر گشت ناعوورە    بامیە و تەماتە و تورە

لە وڵاتی کارگەری پەلەوەر    مریشک دێنێتە بەر

هەر چیی بە خەیاڵ نادێ    دەستمان دەکەوێ لە دێ

یاخوا نموونەی زۆر بێ    زۆری چاک نەك زڵ و زۆر بێ

# هەرسێکمان (1)

یەک هەڤاڵی، دوو هاماڵی، سێ کەژاڵی

هەرسێکیان هاوڕێی منن، خاوێنن

لەگەڵم پێ دەکەنن، بەتینن

بەتینن، بەتینن

هەموو گەشت، وردو درەشت، پشتاوپشت

ڕۆڵەی ئەم کوردستانەین، شاخانەین

---

١- ئەم شعرەم لە سەر زنجی ئەو گۆرانییە تورکییە داناوە کە دەڵێ (بیر متوم دی، کی متوم دی، ئوچ متوم د) لەعوێی داناییش چونکە لە سەردەمی قوتابیانی بۆلی یەکەم زۆر خۆش بوو...

ئوڵێ باخ و بێستانەین ، لەهەردانەین

لەهەردانەین ، لەهەردانەین

تا دەمرین ، ئالای ژین ، هەڵدەگرین

بە کۆیلەتی ڕازی نین ، نافەوتین

پشتی دوژمن دەشکێنین ، نابەزین

نابەزین ، نابەزین

# ئەو نانە نانە، ئێستا لە خوانە

پشیلەکی پەڕ لەکەوتوو — لەشی مردووی بەرەو زیندوو

بە مشکێکی ئاوەی وت — بەسیە چیدی فڕتە فڕت

توانای [illegible]م نەماوە — دانەکانم شکاوە

تۆبە لە ڕاوی مشک — لەوانی دیش سەرپشک

وانیشە لە ژوورەبەرم — هاودەنگم بە تا دەمرم

مشکەش زوو هەڵخەڵەتا — ملی خۆی خستە بەرتا

چووە لای بێ سەرترسی — ئینجا پشیلەی برسی

هەندێ یاری لەگەڵ کرد — دوایی هەڵیقۆ بۆ بەرد

مشکەش گوتی بەڕێزم — لە پێش ئێوە بێ هێزم

بەرەڵام کەن و بەردەی پێم — هەر لەم بەفرانە دەژێم

تا بێچوه‌کانی زل ده‌بن — شه‌نگ و شل و مل ده‌بن

به‌ خۆمه‌وه‌ قوربانی — تۆزێ و تۆزگه‌وره‌مانی

له‌ خۆشی ئه‌م به‌رسلیه‌ — مشکه‌ی به‌ر داپشیله‌

مشکه‌ش رایکرده‌ کونی — گوێی پشه‌ی بۆگه‌نی

نه‌م زانی واکه‌وده‌نی — به‌ خه‌یاڵی ده‌لی خه‌نی

نه‌تزانیوه‌ پێشینان — له‌ دێر زه‌مانی گوتویان

که‌ وایه‌ و نانه‌ نانه‌ — له‌ به‌رچه‌نگه‌ و له‌ خوانه‌

# مەتەڵ

وردیلەکانم جوانییە مەتەڵ    بە پیتی کوردی لەکیس مەدەن هەڵ

جوانترین دیاری خوایە بۆ مرۆڤ    بوون ونەبوونی هەردووە بنەڕۆف

پیتی یەك وسێ چوارشی هەبێ    هیچ کەسێ بە بێ ئەوشتە نابێ

دووەم وسێ یەم چوارشی لەگەڵ    بەکاردەهێنرێ بۆ ژێر پێی ئاژەڵ

پیتی یەکەم ولەگەڵ چوارەم پیت    دەم وچاو وگوێ ولوت هەڵدەگرێ قیت

پیتی چوار ویەك بە هێزی بازوو    بەکاردەهێنرێ بۆ کردنی خانوو

ساقشتیلەکان مەتەڵ هەڵێنن    گرەوی خۆتان لێیان بسێنن

بۆ کوڕان توپ وبۆ کچان بووکە    سەرتان نەشێوێ مەتەڵ زۆر سووکە

ئەوەی بیزانێ زیرەك وژیرە    خاوەنی بەهرەو ڕاووتە گیرە

ئەگەر نەشزانی زیاتر بخوێنە    زیتر هەولدەو چاوت هەڵێنە

# مەتەڵ

بە پیتی کوردی مەتەڵ شەش پیتە ‌ ‌ ‌ ئەدەبگێزانی چاپووک و زیتە
ئەموو سروشتێک ماڤیتی ئەیبێ ‌ ‌ ‌ گەر یەکێ نەیبوو ژینی لەنگ دەبێ
پیتی یەک و دوو پێشی لەلابێ ‌ ‌ ‌ دەبێ لە زۆربەی خواردنا دابێ
ئەوەو سێ پیتە لەگەڵ چوارەمین ‌ ‌ ‌ جێی گیانە لە بەرێک بێ شەرو نازێ
پیتی چوار و دوو پێش لەگەڵ شەشەم ‌ ‌ ‌ لە ماڵی ئەموو کەسێکە سەرجەم
پیتی پێنج و سێ پاڵپشتی شارە ‌ ‌ ‌ دانیشتوانی ئەمڕۆ دەم لە کارە
لە کۆتاییدا دەڵێم بە خوێنەر ‌ ‌ ‌ ئەموو مەتەڵێ شیکار دەکرێتن

## لانك

لانك چەندە پیرۆزی — كانیی هەست و دڵسۆزی

ئۆقرە گاهی منداڵی — لای لایەكی زوڵاڵی

ترپەم دەكەی لەگریان — دەمپارێزی لە زریان

نە هەوارەی گەرماو سەرما — ناهێڵی بێتە سەرما

خونچەی خۆشەویستی — سەرچەستی و خۆنەویستی

بەسەرمادە بارێنی — مێردەزمە دەتارێنی

ئەم خۆشەویستی وڵات — بۆم دەنێری بە خەڵات

تا لە پێناوی بمرم — نەخشەی لە دڵ هەڵگرم

# پۆلیسی هاتوچۆ

من پۆلیسی هاتوچۆم — چوست و گورج و بێ دەرۆم

ڤیانەی من سەرشەقامە — پیرۆزترین جێنگامە

ماندووم تا ئاسایش — بۆتان دەبێتە ئارایش

بە تایبەتی منداڵان — هاودەنگی جەرگ و دڵان

بۆیان زۆر بەرۆشم — لە ژیان دایان دەپۆشم

لەگەڵ شۆفێریش هەردام — هەر لە چاکە کردن دام

ئەوەی یاسا چاوی بێ — زۆر دووری بە دناوی بێ

خۆشترکە سانە هەڵن — بەناحەق داتی دەگەن

پۆلیس دژی شۆفێرن — نەخێر بە فێڵباز فێرن

# دکتۆر

دکتۆر مایەی ژیانە
خۆشەویستی هەموانە

خۆی نەویست و ماندووە
شەو نخوونی لاخووە

هەموو دلەمیرا و ئاواتی
دەبڕێ گشت سات و کاتی

تەندروستی بۆ گشتە
لە فرمانیا گشتە

بەتایبەتی بۆ منداڵ
باوکە پزیشکی دڵەکان

مخابن بۆ دایکان
کاتێ نەخۆش بوون و گریان

منداڵ کە گری بە دەرزی
دەترسێنێ و دەلەرزێ

یا خود بە ناوی دکتۆر
دەیتۆقێنێ ـ داکە خۆرە

# دەخیلەکەم

دەخیلتم دەخیلکە
زوو بە خۆتم بۆ پڕکە

هەموو ڕۆژ زۆر ڕیاکەمی
ڕۆژانەست دەدەمێ

زەوی خۆم جێڵ دەکەم
تا بە ئامانجم دەگەم

هەرچیم بوێ بێت دەکڕم
بۆ کۆشکی ئاوات دەفڕم

سا منداڵینە هەموو
لەگەڵ من بێ یەک و دوو

بێنە خاوەن دەخیلە
دیلی نەفسیش هەر دیلە

## سوپاس

زۆر سوپاس بۆ کاک (عبدالخالق)ی خۆش نووس

کە بە خامە دەنگینەکەی ئەم شیعرانەی نووسیوە .

هەروەها سوپاسی بێ پایانی بەڕێوەبەر و کارگێرانی

چاپخانەی رۆشنبیری دەکەم کە بەزوو ترین کات

کارەکریان بۆم راپەڕاند ، وێنەیان زۆر بێت .

